# بزووتنەوەی ئازادی خوازی ژنان !

نووسینی: سلیمان بن صالح الخراشی
و: سەربەست محمد | گزنگ @GizingNet

**پێناسینێك ؛**

**بزووتنەوەی ئازادیخوازی ژنان بزووتنەوەیەکی عەلمانی وسیکولارییە، سەرەتا لە میسرِدا سەری هەڵهێنا ودواتر بە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بڵاو بۆوە. ئەم بزووتنەوەیە بانگەشەی ئازادکردنی ژن لە رِەوشت وئادابە ئیسلامییەکان وحوکمە شەرعییەکانی تایبەت بە ژنان دەکات؛ وەك پرسەکانی حیجاب، وسنووردارکردنی تەڵاق، ونەهێشتنی فرە ژنی ویەکسانی ژن وپیاو لە میرات و، بە شێوەیەکی گشتی لاساییکردنەوەی ئافرەتی رِۆژئاوایی لە هەر سیفەت ورِەوشتێکیدا. ئەم بزووتنەوەیە لە دروستکردنی کۆمەڵە ویەکێتی ژنانەوە پەیامی خۆی لە جیهانی عەرەبیدا بڵاو کردەوە.**

## ▪ دروستبوون ودیارترین کەسایەتییەکانی؛

**بەر لەوەی بزووتنەوەیەك دروستبێت وبە شێوەیەکی سیستمی ورِێکخراوەوە لە چوارچێوەی کۆمەڵەیەکدا؛ بە ناوی "یەکێتی ژنانە"وە بانگەشەی ئازادکردنی ژنان بکات، لە پێشدا ژێرخانییەکی تیۆری وفیکری بۆ کرابوو ولە سێ کتێب وگۆڤارێکدا لە میسرِ خرابووە رِوو.**

**- کتێبی؛ ئافرەت لە رِۆژهەڵات دا | لە دانانی (مرقص فەهمی موحامی) بە رِەچەڵەك دیان ومەسیحی، لەوێدا داوای لە ناوبردنی حیجاب وئاسایی کردنی تێکەڵاوی ژن وپیاو دەکات، وداوا دەکا تەڵاق دان سنووردارکرێ ورِێگە بە پیاو نەدرێ زیاتر لە یەك ژن مارە بکاتو، ژنانی موسوڵمانیش بتوانن بە ئاسایی شوو بە پیاوانی مەسیحی بکەن.**

**- کتێبی؛ ئازادکردنی ژن | دانانی قاسم ئەمین کە لە ساڵی ١٨٩٩ دا بە پشتگیری شێخ محمد عەبدە وسەعد زەغلوول وئەحمەد لوتفی سەیدەوە بە چاپی گەیاند. لەو کتێبەدا قاسم ئەمین ئەوە دەڵێ کە حیجاب وبالاپۆشی باوی ئەمڕۆ کاری بە ئیسلامەوە نییەو، بانگەوازی سفووری دەرچوون وشۆڕش نییە بە ڕووی دینەوە.**

**- کتێبی؛ ئافرەتی نوێ | کە دیسان قاسم ئەمین نووسیبووی ولە ساڵی ١٩٠٠ دا چاپی کردبوو، لەوێدا هەمان بیر وبۆچوونەکانی کتێبی یەکەمی دووبارە دەکاتەوەو، بەڵگە بۆ قسەکانی لە وتەو لاف وڕاو بۆچوونی ڕۆژئاواییەکانەوە دێنێتەوە.**

**- گۆڤاری سفوور؛ لە ئاکامی شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە لایەن لایەنگرانی سفووری ژنەوە دەرکراو، زیاتر تیشکی دەخستە سەر باسەکانی سفووری وتێکەڵاوی ژن وپیاوەوە.**

**بەر لەوەی سفووری لە نێوان ئافرەتانی میسرِدا بڵاو بێتەوە، ژنان بە پێشڕەوێتی "هودا شەعراوی" (خێزانی عەلی شەعراوی) لە شۆڕشی ساڵی ١٩١٩ دا بە شێوەیەکی بەرجەستە بەشدار بوون، وسەرەتای بزاڤی سیاسییان بە ڕێپێوانێکەوە دەستپێکرد کە سەر لە سبەینەی ٢٠ی ئاداری ساڵی ١٩١٩ ز بەڕێوەچوو.**

**یەکەم هەنگاو لە ڕێڕەوی سفووریشدا ئەو کاتە بوو کە سەعد زەغلوول داوای لە ژنانی ئامادەبووی کۆڕ ووتارەکانی دەکرد لەچك ونیقابی سەر ڕوومەتیان لادەن، وهەر خۆشی بوو کە حیجابی لە ڕوومەتی "نور الهدى محمد سلطان"ی ناسراو بە هودا شەعراوی لادا، ئەو کاتەی کە لە هەندەران هاتەوەو لە ئەسکەندەریەی میسرِ پێشوازی لێکرا، دواتر ژنان لەسەر هەمان ڕێچکەدا دەستیان کردە فڕێدانی حیجابیان.**

یەكێتی ژنان لە نیسانی ساڵی ١٩٢٤ ز دوای گەڕانەوەی پێكهێنەرەكەی لە كۆنگرەی یەكێتی ژنانی نێودەوڵەتیی ڕۆماوە ساڵی ١٩٢٢ ز دروستبوو. ئەم یەكێتییە لەسەر ڕێچكەی پێشووی ئەو نووسەرانەی وەك فەهمی موحامی وقاسم ئەمین بوو وهەموو بنەما وبیرۆكەكانیانی لە خۆ گرتبوو.

یەكێتی ژنان ڕێ خۆشكەر بوو بۆ ئەوەی دوای تێپەڕبوونی بیست ساڵ لەو ڕووداوە – واتا ساڵی ١٩٤٤ ز – كۆنگرەی یەكێتی ژنانی عەرەب ببەسترێت وئەو كات لە هەر وڵاتێكی عەرەبی نوێنەرێكی ژنان ئامادەی كۆنگرەكە بوون، لە عەینی كاتدا بەریتانیاو ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەستخۆشییان لە كۆنگرەكە كرد وتەنانەت خێزانی ڕۆزفلتی سەرۆكی ئەمریكا بروسكەی پشتگیری خۆی بۆ كۆنگرەكە نارد.

## دیارترین كەسایەتییەكانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی ژنان ؛

شێخ محمد عەبدە | بیرو ڕاكانی ئەم پیاوە ئەو باخە بوو كە بیرۆكەكانی كتێبی ئازادكردنی ژنیان تێدا ڕوا، ئەم كتێبە هاوڕای زۆر لە بیرو ڕاكانی شێخ بوو كە بابەتەكانی مافی ژنان وباسكردنیانی لە وتارەكانی "وقائع مصرية"دا بەرجەستە دەكرد، وەرگێڕانەوەی تەفسیرەكەی ئایەتی حوكمە شەرعییەكانی ژنانی محمد عەبدە بوو.

سەعد زەغلوول | كە سەرۆكی حیزبی وەفدی میسرِی بوو، وخۆی هانی قاسم ئەمینی دا كتێبەكانی بە دەر بێخێت وپشتگیری لەو بوارەدا لێ كرد.

لوتفی سەید | كە نازناوی "ئوستادی نەوە"ی لێنرابوو ولە لاپەڕەی ڕۆژنامەی زمانحاڵی حیزبی ئوممەی میسرِی سەردەمی خۆی؛ بەردەوام خەریكی بانگەشە كردن بوو بۆ بزووتنەوەی ئازادیخوازی ژنان.

**هودا شەعراوی | كچی (محمد سولتان پاشا)ی هاوڕێی داگیركەری ئینگلیز لە كاتێ پێشڕەوی كردنیاندا بەرەو قاهیرەی پایتەختی میسر، ولە هەمان كاتیشدا خێزانی (عەلی شەعراوی پاشا)ی ئەندامی حیزبی ئوممەت (حیزبی وەفدی ئێستا) ویەكێ لە هاندەر ولایەنگرانی سفووری.**

**سیزا نبراوی | (كە نێوە ئەسڵییەكەی زەینەب محمد موراد بوو) وهاوڕێی هودا شەعراوی بوو لە كۆنگرە نێودەوڵەتی ونێوخۆییەكاندا. ئەم دووەش یەكەم كەس بوون دوای گەڕانەوەیان لە ڕۆژئاواو ئامادەبوونیان لە كۆنگرەی یەكێتی ژنانی نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٢٣ی ڕۆما حیجابیان لە میسردا فڕێدا.**

**دوریە شەفیق | كە یەكێ لە قوتابییەكانی لوتفی سەید بوو، بە تەنها خۆی بۆ بە دەستهێنانی دكتۆرا سەفەری بۆ فەرەنسا ودواتر بۆ ئینگلترا كرد و، دەزگا میدیاییە ڕۆژئاواییەكان لە وێنەی ژنی بانگخوازی ئازادبوون لە كۆت وبەند ونەریتەكانی ئیسلامی وەك حیجاب وتەڵاق وفرە ژنی نەخشەیان دەكێشا.**

**دوریە شەفیق كاتێ گەڕایەوە میسر حیزبی (كچی نیل – بنت النیل)ی لە ساڵی ١٩٤٩ز دا بە كۆمەك وپشتگیری باڵوێزخانەی ئینگلیزی وئەمریكییەوە دروستكرد، ئەوەی دواتر بە جیابوونەوەی ئەندامێك لە ئەندامەكانی ئەو حیزبە دووپاتكرایەوەو هەر ئەوە هۆكاری دەست لەكاركێشانەوەی ئەو ئەندامە بوو. دوریە شەفیق خۆی پێشڕەوی خۆپیشاندان وڕێپێوانەكانی دەكرد كە بە نێوبانگترینیان ئەو ڕێپێوانە بوو كە لە ١٩ی شوباتی ١٩٥١ز و١٢ی ئاداری ساڵی ١٩٥٤ز بە هەماهەنگی لەگەڵ دەزگاكانی حوكمەتی جەمال عەبدولناصرەوە بە ڕێوەچوو، ئەو كات ژنانی سەندیكای ڕۆژنامەنووسان مانگرتیان لە خۆراك تا مردن ڕاگەیاند ئەگەر بە دەم داواكارییەكانیانەوە نەچن، ئەوە بوو داواكانیان بە دی هێنران ودوریە شەفیق لە هەڵبژاردندا بەشدار بوو بەڵام سەركەوتنی بەدەست نەهێنا وڕۆڵەكەی كۆتایی پێهات. دواتر خەریكی بەشداریكردن بوو لە كۆنگرە نێودەوڵەتییەكانی ژنان بۆ ئەوەی – وەك خۆی ئەڵێت – داكۆكی لە مافەكانی ژنان بكات.**

**سوهەیر قلماوی | کە لە زانکۆی ئەمریکی دا لە میسڕ پەروەردە بوو بوو ولە پەیمانگای ئەمرییەکانەوە پێگەیشتبوو ودواتر لە چەندین زانکۆی ئەمریکی وئەورووپیدا حازر بوو؛ تا لە کۆتاتدا گەڕایەوەو لە زانکۆی میسڕیدا خەریکی وانە وتنەوە بوو.**

**ئەمینە سەعید | کە یەکێك بوو لە قوتابییەکانی تاها حوسێن؛ ئەو ئەدیبە میسڕییەی داوای بە ڕۆژئاواییکردنی میسڕی دەکرد. ئەمینە سەعید سەرنووسەری گۆڤاری حەواء بوو، وزۆر بە جورئەتەوە هێرشی دەکردە سەر حیجابی ژنان. یەکێك لە وتەکانی لە سەردەمی عەبدولناصر دا ئەوەبوو کە؛ "چۆن ملکەچی چوار فەقیهی لە دایکبووی چاخی تاریکی بین، لە کاتێکدا کە پەیمانمان لە دەستدایە" مەبەستی ئەو دەستوور وپەیمانەی عەبدولناصر بوو کە بانگەشەی ئیشتراکیەتی وکۆمونیستی دەکرد. ئەمینە سەعید گۆڤاری حەوای بۆ هێرشکردنە سەر ئاداب وخوڕەوشتە ئیسلامییەکان تەرخان کردبوو وتا ئێستاش خەریکی ئەم ڕۆڵەیە.**

**د. نەوال سەعداوی | سەرۆکی ئێستای یەکێتی ژنانی میسڕ.**

## فیکر وبیرو باوەڕەکانیان ؛

**دەتوانین بیرو باوەڕەکانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی ژنان لەم چەند خاڵانەدا کورت کەینەوە، کە چەند لقێکی پرۆسەی ئازادکردنی ئافرەتن لە هەر چی ئاداب وخوڕەوشت وشەریعەتی ئیسلامی هەیە، لە ڕێگەی :-**

- **بانگەشەی ئافرەتان بۆ سفووری وسەرکۆتی ولە ناوبردنی حیجابی ئیسلامی.**
- **بانگەشە کردن بۆ تێکەڵاوی ژن وپیاو لە تەواوی بوارەکانی ژیاندا؛ بە خوێندنگە وزانکۆ ودەزگا حکومی وبازاڕەکانەوە.**
- **سنووردارکردنی تەڵاق وئیکتیفا کردن بە یەك ژنەوە.**
- **یەکسانی پیاو وئافرەت لە میراتدا.**

- **بانگەوازی عەلمانیەت وسیکولاریزمی ڕۆژئاوایی، یا ئەگەر ناوێکی تری لێ بنێین بێ دینی، کە وای لێ بێ دین بە تایبەت دەست لە ژیانی کۆمەڵایەتی وەرنەدا.**
- **داکۆکی کردن لە مافە کۆمەڵایەتی وسیاسییەکان.**
- **ئەوروپا وڕۆژئاوا بە گشتی ببنە پێشەنگی کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتی ئافرەت؛ وەك کار، وئازادی جنسیو، بواری چالاکییە وەرزشی وڕۆشنبیرییەکان.**

## ڕەگە فیکری وعەقەدییەکان:

**دوای دروستبوون وهاتنە پێشەوەی بزووتنەوەی ئازادیخوازی ژنان؛ لە بەرگی یەکێتی ژنانەوە لە وڵاتان وبە تایبەتی لە وڵاتی ئێمەدا، بێ دینی یاخود عەلمانیەت – وەك چۆن حەز ئەکەن ناوی بنێن –، عەلمانیەتی ڕۆژئاوایی بووە ژێرخانی فیکری وئایدۆلۆژیای بزووتنەوەی ئازادیخوازی ژنان. تیشکی ئەو بزووتنەوەیەش بە تایبەتی ئاڕاستەی وڵاتە ئیسلامییەکان وئافرەتی موسوڵمان کرابوو، بۆ ئەوەی سەرەتا ئافرەتی موسوڵمان لە دینەکەی دەرکەن ودواتر لە ڕووی کۆمەڵایەتی وئەخلاقییەوە بیپووکێننەوە. بە فەساد وتێکچوونی ئافرەتی موسوڵمانیشەوە کۆمەڵگای ئیسلامی تووشی فەساد دەبێتو، شەپۆلی ئەو حەماسەت وعیزەتە ئیسلامییەی لە بەرامبەر ڕۆژئاوای خاچ پەرست ودوژمنانی ئیسلامدا وەستاوەتەوە کۆتای پێ دێت، بەمەش دەتوانن ئاسانتر کۆنترۆڵی کەن.**

**بەڵگەی ئەوەی ڕیشەکانی ئەم بزووتنەوە ئازادیخوازییەی ژنانیش بەرەو عەلمانیەتی ڕۆژئاواوە باڵ دەکێشێ لە چەند خاڵێکدا دیارە کە؛**

**- ساڵی ١٨٩٤ز کتێبی نووسەرێکی فەرەنسی بە ناوی "ئەلکونت دارکور"ەوە چاپکرا، لەوێدا نووسەر بە توندی باسی ژنانی میسڕ وحیجابی ئیسلامی دەکات وڕەخنەی توند لە بێ دەنگی ڕۆشنبیران دەگرێ.**

**- ساڵی ١٨٩٩ز قاسم ئەمین کتێبی ئازادکردنی ئافرەتی چاپ کرد وڕاو بۆچوونەکانی "دارکور"ی خستە ڕوو.**

**- لە هەمان ساڵدا سەرۆکی نیشتیمانی میسر مستەفا کامل (سەرۆکی حیزبی نیشتمانی) هێرش دەکاتە سەر کتێبی ئازادکردنی ژن، وبیرۆکەکانی بە ئیستیعمار وداگیرکەری ئینگلیزییەوە دەبەستێتەوە.**

**- بازرگان وپیاوی ئابووری بەناوبانگی میسر (محمد تەڵعەت حەرب) کتێبی "پەروەردەکردنی ژن وحیجاب" لە ڕەتدانەوەی قاسم ئەمین دا دەنووسێت، ویەکێ لە وتەکانی ئەوە دەبێت کە: "نەهێشتنی حیجاب وبانگەشەی تێکەڵاوی؛ هەردووکیان ئاواتێکن ئەوروپا خەونیان پێوە دەبینێ".**

**- ئینگلیزەکان لە کاتی مانەوەیان لە میسردا کتێبی ئازادکردنی ژن بۆ سەر زمانی ئینگلیزی وەردەگێڕنو لە وڵاتی هیند وکۆلۆنییە داگیرکراوە ئیسلامییەکاندا پەخشی دەکەنەوە.**

**- پەیوەندی حیزبی (کچی نیل) بە باڵوێزخانەی ئینگلیزییەوەو وئەو پاڵپشتییەی مادیەی لێی وەردەگرتن؛ وەك لە باسی دوریە شەفیقدا خستمانە ڕوو.**

**- پێشوازی ڕۆژنامە بەریتانیەکان لە دوریە شەفیقی سەرۆکی (حیزبی نیل) وپێشکەشکردنی وەك بانگخوازی گەورەی ئازادکردنی ژنی میسری لە کۆت وبەند ونەریتەکانی ئیسلام.**

**- بروسکەی کۆمەڵەی (سان جێیمس)ی ئینگلیزی بۆ سەرۆکی حیزبی (کچی نیل)، تێیدا دەستخۆشی لە ئاڕاستەی تازەی حیزبەکەی لە بەڕێوەبردنی خۆپیشاندان وڕێپێوانەکانیان بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانی ژنان دەکات.**

- بەشداریکردنی خودی سەرۆکی ئەو حیزبە لە کۆنگرەی ژنانی نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٥١ز لە ئەثینا، کە دیار بوو لەو کۆنگرەیەو بە ڕازیبوونی بە بڕیارەکانییەوە خزمەتی بۆ داگیرکەر وئیستیعمارە زیاتر لەوەی خزمەتی بۆ وڵاتی خۆی بێت.

- ڕاگەیاندنی (کامیلا یفی)ی هیندی کە؛ یەکێتی ژنانی نێودەوڵەتی لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتە ڕۆژئاوایی وئیستیعمار وداگیرکەرەکاندایە، ودەست لە کارکێشانەوەی لەو یەکێتییە.

- ڕاگەیاندنی دکتۆرە نەوال سەعداوی سەرۆکی یەکێتی ژنانی میسری لە ساڵی ١٩٨٧ز لە ئاکامی کۆنگرەکەیاندا؛ کە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان پارەو بودجەی پێویستی بەستنی کۆنگرەی یەکێتی ژنانیان لە ئەستۆ گرتبوو ودەوڵەتە ئیسلامییەکان بەشیان لەو هاوکارییەدا نەبوو.

ئەمە بەشێکن لەو بەڵگانەی نیشانەیەکی ڕوون وئاشکرا ئەدەن کە بێ گومان بزووتنەوەی ئازادیخوازی ژنان پەیوەندی پتەوی بە هێز ودەسەڵاتە داگیرکەرییە ڕۆژئاواییەکانەوە هەیە.

## لەوەی پێشووەوە بۆمان دەردەکەوێ؛

کە بزووتنەوەی ئازادیخوازی ژنان بزووتنەوەیەکی عەلمانی وسیکولارە کە سەرەتا لە میسرڕدا سەری هەڵهێناو، لەوێوە لە وڵاتانی ئیسلامیدا پەخش بووەوەو، مەبەست وئامانجی دابڕانی ژنانە لە ئادابە ئیسلامی وحوکمە شەرعییەکانی تایبەت بە ژنانی وەك حیجاب وسنووردارکردنی تەڵاق وڕێگرتن لە فرە ژنی ویەکسانی لە میراتدا ولاسایی کردنەوەی هەموو شتێکی ئافرەتی ڕۆژئاوایی. کتێبەکانی (ئافرەت لە ڕۆژهەڵاتدا – مرقص فەهمی موحامی) و(ئازادکردنی ژن وژنی نوێ - قاسم ئەمین) گرگنترین کتێبێکن کە بانگەشەی سفووری ودەرچوون لە دین دەکەنو، ئامانجەکانی ئەم بزووتنەوەیە باڵ بۆ ئەوەی دەکێشن کە عەلمانیەت وبێ دینی ببنە بەردی بناغەی بزاڤی ژنان وکۆمەڵگا.

